# مافەکانی نەخۆش

# Patient rights

١- مافی خۆتە لە شوێنێکی تایبەت و بەرێزەوە ببینرێت.

٢- مافی خۆتە هەموو ڕاستیەکان سەبارەت بە ڕێگەکانی چارەسەر بزانیت سوود و ماکەکانی هەر یەکەیان.

٣- مافی خۆتە هەموو پرسیای بکەی لەمەر ئێستا و ئایندەی حاڵەتەکەت .

٤- مافەی خۆتە ناوی سەرجەم ئەو ستافە بزانیت کە چارەسەرت بۆ دەکەن لە نەخۆشخانە.

٥- مافی خۆتە رەزامەند بیت لەسەر چارەسەرکردن وەك چۆن مافی خۆتە چارەسەر رەتبکەیتەوە .

٦- مافی خۆتە بە تەنیا لەگەڵ پزیشکەکەتدا قسە بکەیت و داوا بکەی نەخۆشەکانی تر بچنە دەرێ یان کەسوکارت بچنە دەرێ هەر پزیشکێ ئەو داواکاریەکەت جێبەجێ نەکات ئەوە دەستدرێژی کردۆتە سەر مافەکانت بۆت هەیە هەڵوێستی شیاو وەرگریت.

٧- مافی خۆتە داوای راپۆرتی پزیشکی بکەیت لەمەر نەخۆشیەکەت یان گەر راپۆرتیان بۆ نوسیت بزانیت چی نوسراوە.بەهەر زمانێك بێت.

٨- مافی خۆتە ڕازی بیت یان نا لە بەشداری کردن لە توێژینەوە.

٩- مافی خۆتە کە ڕێگە نەدەیت خوێندکار بتبینێت چونکە نەخۆشخانەکانی ئێمە تایبەتن بە وەزارەتی تەندروستی نەك وەزارەتی خوێندنی باڵا .

١٠- مافی خۆتە کە خۆت یان کەسوکارت یان یاوەرت کە هەڵەیەکتان بینی ئاگاداری پزیشك بکەینەوە.

١١- پزیشك دادوەر نیە مافی نیە سزای تۆ بدات لەسەر ڕەفتارەکانت کاتێك هەڵەیەکت کردبێ بۆی نیە سەرزەنشتت بکات بەلام بۆی هەیە پرسیار بکات.

١٢- ئەو پرسیارانەی کە زۆر تایبەتن مافی خۆتە وەلام نەدەیتەوە و کار ناکاتە سەر چاسەرکردنت. پزیشك بۆی نیە بەزۆر زانیاریت لێوەرگرێت یان پێت بلێ گەر پێم نەلێی فلانە شتت بۆ ناکەم یان فلانە پشکنینت بۆ ئەنجان نادەم.

١٣- مافی خۆتە کاتی پێویستت هەبێت بۆ باسکردنی کێشەکەت ( ٧٠٪ پزیشکان لەماوەی کەمتر لە ١٨ چرکەدا قسە بە نەخۆش دەبرن ) ئەمە گەر ڕێگەی بدەن قسە بکات.

١٤- مافی خۆتە بروانیتە فایلەکەت و بزانیت جی تیا نوسراوە گەر بە زمانێك بوو کە نەتئەزانی مافی

خۆته داوابكەی بۆت وەربگێرێته سەرئەو زمانەی كە تێی دەگەیت بە وەرگێرانی زارەكی نەك نوسین.

١٥- مافە خۆته داوای پاراستنی نهێنیەكانت بكەیت لە زانیاری و جۆری نەخۆشی بەبێ رەزامەنی تۆ نابێت بەكەس بوترێت.

١٦- مافی خۆته رێگە نەدەیت بە وێنەگرتنت لە لایەن پزیشك ، كارمەندی تەندروستی ، خوێندكار بۆ هەر مەبەستێك بێت.

١٧- زانینی جۆر و مەبەستی پشكنینەكان .

## بەرپرسیارێتیەكانی نەخۆش :

١- ووتنی راستیەكان سەبارەت بە نەخۆشیەكە.لە ئێستاو رابردوودا.

٢- ناوی ئەو دەرمانانەی وەریدەگریت.

٣- پەیرەوی كردنی رێنماییەكان.

٤- ئاگاداركردنەوەی پزیشك لەكاتی وەرگرتنەوەی ئەنجامی پشكنینەكان.

٥- ئاگاداركردنەوەی پزیشك و كارمەند لەكاتی تێنەگەشتن لە چۆنێتی بەكارهێنانی چارەسەر.

٦- هەلگرتنی بەرپرسیارێتی گەر رازی نەبووی بە چارەسەركردن یان نەشتەرگەری.

٧- رێزگرتنی مافی نەخۆشەكانی تر لە دەنگە دەنگ و ژمارەی سەردانەكان و ژمارەی ئەوانەی سەردانت دەكەن.

٨- رێزگرتنی یاساكانی نەخۆشخانە وەكو جگەرە نەكێشان و بەكارنەهێنانی مۆبایل لەو شوێنانەی كە قەدەغەیە.

٩- تایبەتمەندی كەسانی تر راگرە بیرت بێ ئازادی تۆ كۆتای دێت كاتێ مافی تاكەكانی تر دەست پێ دەكات.

١٠- هەر گۆرانكاریەك لە حالەتەكەت روی دا ئاگاداری پزیشك یان كارمەندی تەندروستی بكەرەوە.

# پێـــرســـت